# ئارامگرتن

ئامادەکردنی: هێلانە

لەسەردەمانێکی زوودا، پیاوێک دووگوێدرێژی هەبوو، ڕۆژانە بەم گوێدرێژانە لە گوندەکەی خۆیدا بەرهەمەکانی بەرەو شار دەگوازتەوە و لەوێشەوە کەلوپەل و پێداویستییەکانی خۆیانی پێدەهێنایەوە. ڕۆژێکیان کە لەشار دەگەڕاوە، کۆمەڵێک دۆشەگی ئیسفەنجی لە یەکێکیان و گونیەک خوێی لەوەی دیکەیان  بارکردبوو. ئەو گوێدرێژەی ئیسفەنجەکەی هەڵگرتبوو زۆر بەکەیف هەنگاوی دەنا و بە گاڵتەوەش لە هاوڕێیەکەی دەڕوانی، لەژێرەوەش پێکەنینی پێدەهات و ناوناوەش کە خاوەنەکەیان نەیدیبا، لەقەیەکی بۆ گوێدرێژەکەی دیکە دەهاویشت. بەڵام گوێدرێژەکەی دیکە هیچ خۆی تێکنەدا و بارەکەی سەر پشتی بە ئەرکێکی ئاسایی سەرشانی وەرگرت. هێندەی پێنەچوو هەورێکی ڕەش بەری ئاسمانی گرت و گەوارەیەکی بەخوڕ دایکرد. ئیسفەنجەکانی سەر پشتی گوێدرێژە لەخۆباییەکە تەڕبوون و تا دەهات ئاوی زیاتریان هەڵدەمژی، بەمەش کێشی گەلێک زیادیکردو گوێدرێژەکەی هیلاک کرد. لەبەرامبەردا برێک لە



خوێیەکەی سەر پشتی گوێدرێژە ئارامگرتووەکە بەهۆی بارانەکە توایەوەو بەمەش کێشی کەمبۆوە. ڕێگا زۆری مابوو هەوراز دوای هەوراز دەهات تا گەیشتنەوە گوندەکەیان، گوێدرێژی گاڵتەباز ئازاری زۆری بینی و چەند ڕۆژێک دوای ئەمەش هێشتا نەهاتبۆوە سەرخۆ. بەڵام ئەم ڕووداوە وانەیەکی گرنگی فێرکرد، ئەویش نەنازین بوو بەشتێک کە لە دەسەڵاتیدا نەبێت لەگەڵ گاڵتەکردن بە بەرامبەر.




هێلانەی منداڵان

گۆڤارێکی مانگانەی منداڵانە
ڕۆژنامەی ( خەبات ) دەری دەکات

خاوەنی ئیمتیاز
**عەلی عەبدوڵڵا**

سەرنووسەر
**نەژاد عزیز سورمێ**



**ناونیشان**
**هەولێر - تەنیشت سەرۆکایەتی زانکۆ**
**تەلەفۆن:** 2220506
Email: helana_xebat@yahoo.com



Helanayi Mindalan
Govareki Zarokane Rojnama
Xebat Deredexit

**Serniviskar**
**Najad Aziz Surme**

چاپخانا خانی دهوك

# فەرفووری سەرچل

نووسینی: د.محەمەد مورۆ
ئامادەکردنی: هێلانە

فەرفوور بێچووە مشکێکی زۆر بزێو بوو. هەندێک جار لاسایی دەنگی ئاژەڵەکانی دیکەی دەکردەوە، جارجاریش پێستی وەهای دەپۆشی تا لە ئاژەڵی دیکە بچێت و هاوڕێکانی بترسێنێ. ڕۆژێکیان وەک سەگ کەوتە وەڕین. بۆ ڕۆژی دوایی بەرگی تیمساحی پۆشی و هاوڕێکانی ترساند. بەم کارەی زۆر دڵخۆش بوو. بەڵام بەردەوام دایکی ئاگاداری دەکردەوە و ئامۆژگاری دەکرد دەست لەو کارە نابەجێیانە هەڵبگرێت. جارێکیان فەرفوور جلی پشیلەی پۆشی و کەوتە ناو هاوڕێکانی ئەوانیش هەریەکە بە هەڵەداوان بۆ لایەک ڕایانکرد. فەرفوور خۆشی لێهات و لەبیری چۆوە خۆشی مشکە، بۆیە بەرەو لای پشیلەکان چوو و لەگەڵ ئەوان کەوتە یاری. هێندەی پێنەچوو کاتێک کە ویستی خۆی هەڵبدات، جلەکەی داماڵرا، ئەوسا ڕاستی بۆ پشیلەکان دەرکەوت و بەخێرایی کەوتنە دووی. هێندەی نەما فەرفوور تیا بچێت بەڵام بەخێرایی خۆی ئاخنیە ناو کونێکەوە، بەر لە ڕزگاربوونیشی پشیلەیەک تووند کلکی گرت و بەرینەدا تا قرتاندی. لەو ڕۆژەوە فەرفوور بێ کلک مایەوە، بڕیاریدا چیتر لاسایی گیانەوەرانی دیکە نەکاتەوە، بەڵام کە دەچووە ناو هاوڕێکانی ئەوان بە گاڵتەوە لێیان دەپرسی: فەرفوور کوا کلکت؟ بەم پرسیارە فەرفوور دڵگران دەبوو، پەشیمانی بەرۆکی دەگرت و خۆزگەی دەخواست وەک جاران تەواو با. کاتێک کە سکاڵاشی لای دایکی کرد، دایکی پێیوت: پشیلە کلکی تۆی قوت نەکرد، بەڵکو لە خۆباییبوونت بەرامبەر بە هاوڕێکانت بەم دەردەی بردیت. دواتر دایکی پێیوت: لەخۆ بایی بوون پشتت دەشکێنێ. بۆ ڕۆژەکانی دواتر فەرفوور بەڕێز و خۆشەویستییەوە پێشوازی لە هاوڕێیەکانی دەکرد و یاری لەگەڵ دەکردن، تا وای لێهات لەبیری چۆوە کلکی قرتاوە و چیتر خەفەتی لێ نەخوارد.





# چۆن بولبول بوو بە پاشا



ڕۆژێکیان باڵندەکان کۆبوونەوە تا پادشایەک بۆ خۆیان هەڵبژێرن. بەتێکڕای دەنگ بولبولیان هەڵبژارد.





لە دارستانێکی دوور، باڵندەی هیندی دەنووک زەرد پاشای باڵندەکان بوو. بەڵام بەهۆی دلڕەقی و خواردنی باڵندە بچووکەکان، هەموو ڕقیان لێی بوو.

چۆن ئەم هەواڵە بگەیەنینە باڵندەی هیندی دەنووک زەرد.

من بیرۆکەیەکم هەیە.

پاش ماوەیەکی کورت.








دەبێت لەسەر لقی دارێک دانیشیت تا دەیشکێنیت!
ئەگەر من نەتوانم بیشکێنم، ئەی کێ دەتوانێت؟
ئەو باڵندەیەی کە ئەم لقە بشکێنێت لەتۆ بەهێزتر و لێهاتووتر دەبێت.
مافی خۆشی دەبێت لەباتی تۆ فەرمانڕەوایی هەموو باڵندەکان بکات.
باڵندەی هیندی دەنووک زەرد تا توانی بەرز فڕی، دواتر بە هەموو هێزی لەسەر لقەکە نیشتەوە.


بالّندەی هیندی دەنووک زەرد هێزی لێبڕاو هەستی بە ماندووبوون دەکرد.
بەڵام لقی دارەکە نەشکا!
کوندە پەپوو لەبیرت بێت ئەوەی مونافەسەم دەکات دەبێت لقێکی وەک ئەوەی من تاقی بکاتەوە.
نۆرەی بولبول هات. ئایا ئەم لقە زۆر بەهێزە؟
بەلی، تەنانەت لەوەش بەهێزترە کە من بۆم نەشکا.
ئەگەر بولبول سەرکەوتوو بوو ئەوا بە دڵنیای مافی خۆیەتی کە ببێتە پاشای بالندەکان.
ئەوە هاتم.




سەرچاوە: گۆڤاری العربی الصغیر ژمارە ٢٢٩

# دۆزینەوەی چا و قاوە

## چا

چا خواردنەوەیەکی گەرمی بڵاوە لە جیهان. باوترین خواردنەوەی گەرمە. لەڕێگای بەکارهێنانی ئاوی کوڵاو و گەڵای وشکی رووەکی چا ئامادە دەکرێت. چا رووەکێکی خولگەییە، لەسەر گردەکان دەڕوێت و بەخێرایی گەشەدەکات. دوای کۆکردنەوەی گەڵاکان، لە کارگە ئامادەدەکرێن. سێ جۆری چا هەیە. چای رەش، چای سەوزو چای تێکەڵ.





لەدەوروبەی ساڵی ٢٧٢٧ پ.ز کاتێک (شین نۆنگ)ی ئیمپراتۆری چینی کە ئاوی خواردنەوەی دەکوڵاند، چەند گەڵایەکی ڕووەکی چای کیوی کەوتنە ناو کاسە شاهانەییەکەی و ڕەنگی ئاوەکەیان گۆڕی. دوای تام کردن، هەستی بەوەکرد ئاوەکەی تامێکی خۆشی وەرگرتووە. لەوکاتەوە دەبێت بەخۆشترین خواردنەوەی ئەم پادشایە. لەساڵی ٦٠٠ی زایینی چا لە ژاپۆن بڵاودەبێتەوە، دواتر لەساڵی ١٦١٠ بۆ یەکەمجار بازرگانە هۆڵەندییەکان چایان گەیاندە ئەوروپا. ساڵی ١٧٦٧ خواردنەوەی چا لە بەریتانیا دەبێت بە خواردنەوەیەکی نیشتیمانی. هیند گەورەترین بەرهەم هێنەری چایە لە جیهاندا دواتر وڵاتی چین دێت، ئینجا وڵاتانی سریلانکا، ڕووسیا، کینیا، ئەندەنووسیا، ژاپۆن، بەنگلادێش، ئەرژەنتین دێن.

### ڕاستییەکی سەرسوورهێنەر:

تیباگ جۆرە چایەکی ئامادەکراوە. داهێنانەکەی بۆ ساڵی ١٩٠٨ دەگەڕێتەوە کاتێک کە بازرگانێک ویستی چا بۆ ڕیستۆرانتەکانی نیویۆرک بەرێت، لە توورەگەی بچووک چای کوتراوی بەکارهێنا تاکو بدرێت بە موشتەریەکان.



چەند جۆرێکی جیاواز لە گەڵای چا

# قــــاوه



دەنکەکانی قاوە

بۆیەکەم جار قاوە وەک ڕووەکێکی کیوی لە ئەسیوپیا هەستی پێکرا، بەڵام ئەمڕۆ لە جاوا و سۆمەترە و هیند و نیمچە دوورگەی عەرەبی و ئەفەریقا و هاوای و مەکسیک و وڵاتانی ئەمەریکای باشوور دەچێنرێت. ئەم ڕووەکە بەڕێککەوت دۆزرایەوە دوای ئەوەی لە ئەسیوپیا بینرا مێگەڵە بزنێک گەڵای ئەم ڕووەکەیان خوارد، بە ڕۆژ دەڵەوەڕان و بەدرێژایی شەویش بێداربوون، دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، گەڵای جۆرەڕووەکێکی نامۆیان خواردووە.

ناوی کۆفی لە وشەی قەهوەی عەرەبی هاتووە، کە لە ساڵەکانی ١٢٠٠ی زاینی قاوە وەک خواردنەوەیەکی گەرم لە دوورگەی عەرەبی بەکاردەهێنرا. پێش ئەم بەرواره تۆی قاوە وەک خۆراک بەکاردەهێنرا.



درەختی قاوە



کوپێک لە قاوە

لە دەورووبەری ساڵی ١٥٠٠ قاوە گەیشته تورکیا. دوای سەد ساڵێکی دیکە گەیشتە ئیتالیا. دواتر بەخێرایی لەناو وڵاتانی ئەوروپی قاوەخانە دامەزرا. لەساڵی ١٦٦٠ گەیشته ئەمەریکا و لەساڵی ١٧٠٠ بۆ یەکەم جار قاوە لە وڵاتی بەرازیل چێنرا.

# ڕۆبن هوود

ڕۆبن هوود یەکێکە لە کەسایەتییە دیارەکانی ناو فۆلکلۆر و گۆرانی و چیرۆکی میللی ئینگلیزی. مێژووەکەی بۆ سەدەکانی ناوەڕاست بەتایبەتی بۆ سەدەی چواردەهەم و پانزدەهەم دەگەڕێتەوە. لە نووسراوەکاندا وەک سوارچاکێکی ئازا و لێزان و لەیاسا دەرچوو ناوی هاتووە. ئەوسا سەردەمی شا ڕیشاردی یەکەم کۆمەڵگەی ئینگلیزی لەم کۆمەلانە پێکهاتبوو دەوڵەمەند، هەژار، لە یاسا دەرچوو هەر یەک لەم کۆمەلانەش داب و نەریتی تایبەت بەخۆیان هەبوو. ڕۆبن هوود لە گرووپی سێیەم بوو، لە دارستانەکانی شیرودی نزیک شاری تۆتینگهام دەژیا لەگەڵ دەستەیەک کە ژمارەیان 140 کەس بوو و پێیان دەوترا (میری مان) دوژمنی سەرسەختیشی شەریفی شاری تۆتینگهام بوو، چونکە ئەم پیاوە بە یاسا توندەکان و باجە زۆرەکانی، خەڵکی دەچەوساندەوە. لەسەرچاوەکاندا باسی ڕۆبن هوود بەشێوەی دیکەش هاتووە ، لەوانە هەندێک دەڵێن جەنگاوەرێکی ئازابوو لە سوپای خاچ دروشمەکان، لە هەندێکی دیکە وەک پاڵەوانێک دژی گەندەڵی و چەوسانەوە ناوی هاتووە. لە هەندێکی دیکە بەسەرکردەی ئەو کەسانە دانراوە کە لە یاسا یاخی دەبوون. بەڵام هەرچۆنێک بێت زیاتر وەها ناسراوە کە سامان و کەلوپەلی لە خەڵکی دەوڵەمەند دەفڕاند و بە هەژارانی دەبەخشی. بەرامبەر بە ژنان و خەڵکی هەژاریش دڵنەرم بوو، بەمەش خۆشەویستی پەیداکردبوو لەگەڵ ئەوەی کار و ڕەفتاری نا دروستبوو.

# وڵاتانی کۆمنوێڵس

وڵاتانی کۆمنوێڵس یان کۆمونۆیلسی بەریتانی، بەو وڵاتانە دەوترێت کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی شاهانەی بەریتانی بوون و ئێستاش سەربەخۆن. ساڵی 1931 بەسەرپەرشتی خودی بەریتانیا یەکێتییەکی خۆبەخشانەیان دامەزراند کە سەنتەرەکەی لە کۆشکی مارلبۆرۆی شاری لەندەنە و کورتکراوەکەشی (CN)، جگە لە هەردوو وڵاتی مۆزەنبیق و ڕواندا.

هەر 53 وڵاتەکەی دیکەی کە پێشتر لە ژێر دەستی بەریتانیابوون بەشدارن لەم یەکێتییە، کە ئەم سەرو ئەو سەری جیهانیان داگرتووە و لەناویاندا وڵاتی گەورە و بە توانا هەیە، هەشیانە بچووک و بێ هێزن، لەوانە ئوستراليا، کەنەدا، نیوزلەندا، پاکستان، گانا، بەنگلادیش، فیجی، تەنزانیا... بەمەش 1،7 ملیار مرۆڤی جیهان دەگرێتە خۆی، کە دەکاتە ¼ی دانیشتوانی جیهان. هەروەها ڕێکخراوەکە ئاڵای تایبەت بە خۆی هەیە کە لەبۆنەکان بەرزدەکرێتەوە. ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە بریتییە لە پشتیوانیکردن لە یەکتری و گەشەپێدانی پرۆسەکانی دیموکراتی و دەسەڵاتی یاسا و مافەکانی مرۆڤ و یارمەتیدان و گەشەپێدان. ڕێکخراوەکە یاسایەکی جێگر و دیاریکراوی نییە، بەڵکو بە بەردەوامی وڵاتانی هاوبەش واژۆو لەسەر ئەو بنەما هاوبەشانە دەکەن کە بەهای یەکێتییەکە بەهێز دەکەن، لەوانە بڕیارەکانی ساڵی 1971ی سنگافورە و بڕیارەکانی هیراری لەساڵی 1991

لەهەمان کاتدا بەریتانیا بەمەبەستی داکۆکیکردن لە مەزنییەتی خۆی، زۆرترین یارمەتی ڕێکخراوەکە دەدات و خۆشی بەسەرپەرشتیاری یەکەم دادەنێت. یەک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم یەکێتییە بریتییە لە (یارییەکانی کۆمنوێڵس) کە تەمەنەکەی بۆ زیاتر لە سەدەیەک دەگەڕێتەوە و پێشتر (یارییەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیایی)ی پێدەوترا، هەر چوار ساڵ جارێک ئەنجامدەدرێت، تاکە جیاوازیشی لەگەڵ یارییەکانی ئۆلۆمپی لەوە دایە پێشبڕکێیەکانی ناوی لەنێوان تاکەکانە نەک لەنێوان وڵاتان، ئەمە جگە لەوەی کە تەنیا تایبەتە بە دانیشتوانی وڵاتانی یەکێتییەکە.

# بوومەلەرزە

بوومەلەرزە بریتییە لە لەرینەوەی زەوی، بەهۆی شکان و گۆڕانی لەناکاوی بەشێکی گەورەی تاوێری دەرەوەی توێکلی زەوی پەیدادەبێت. بوومەلەرزە لەڕووداوە بەهێزەکانی زەوییە، ئەنجامەکەشی دڵتەزێنە. بوومەلەرزەی بەهێز لەوانە هێزەکە 10 هەزار جار گەورەتربێت لە هێزی تەقینەوەی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی. بوومەلەرزە دەتوانێت تاوێرەکان تووشی داشکان و ڕۆچوون بکات، بەمەش وێرانکارییەکی گەورە دێتە ئاراو ژیان بەرەو نەمان دەبات.




**بوومەلەرزە لەناو دەریا-تسۆنامی:** تسۆنامی کۆمەڵێک شەپۆلی یەک لەدوا یەکە، بەهۆی ئەو گۆڕانە توند و سەختانەی کە لە ئاو ڕوودەدات، پەیدادەبێت. بوومەلەرزە لە ژێر دەریا، ئەو شڵەژانەیە کە دەبێتە هۆی بڵند و نەوی بوونی ئاستی ئاو و ئەنجامەکەشی تسۆنامی لێدەکەوێتەوە.

## لەبەرچی بوومەلەرزە ڕوودەدات؟

بوومەلەرزە کاتێک ڕوودەدات کە پلێتەکانی سەر ڕووی زەوەی بشکێن و بگۆڕێن لە شوێنی خۆیان. لەکاتی بەیەک گەیشتنی شەپۆلەکان هێزێکی زۆریان لێدەردەچێت کە دەبێتە هۆی لەرینەوەی زەوی لە ناوچەکانی دەوروبەری. ئەو لەرینەوەیە ئەگەر هێزەکەی زۆربێت، دەبێتە لەناوبەر و تێکشکێنەر. لەوانەشە ببێتە هۆی ڕووخان و وێرانکردنی بینایە و ڕێگاوبانەکان. هەروەها جوولەی تاوێرەکان لەکاتی لەرینەوەکان، بۆی هەیە ڕوبارەکان ڕێرەوی خۆیان بگۆڕن.

### پێوانەکردنی بوومەلەرزە:

زۆربەی بوومەلەرزەکان بە پێوانەی ڕێختەر دەپیورێن. ئەم پێوانەیە لەلایەن (چارلس ڕێختەر) لەساڵی 1934 دانراوە. ڕێگایەکی دیکەش بۆ پێوانەکردنی هێزی بوومەلەرزە دانراوە کە پێوانەی (مێرکالی)یە ئەمەیان پێمان دەڵێت لەکاتی بوومەلەرزەکە، چەند جارڕووی زەوی لەریوەتەوە.



درزی سانت ئەندرێراس لە کالیفۆرنیای ئەمەریکا

### لەکاتی بوومەلەرزەدا چی دەکەیت؟

ئەگەر لە ژوورەوە بوویت، هەوڵی دەرچوون مەدە بۆ دەرەوە، بەڵکو خۆت بخە ژێر کەلووپەلێکی گەورەی جێگری وەک مێز و خۆتی پێوەبگرە تا لێت دوورنەکەوێتەوە. پاش تەواوبوونی لەرینەوەکە بڕۆ دەرەوە و لە خانووەکان دووربکەوە و لە شوێنێکی کراوە بوەستە.

درزی کراوەی ڕاست کاتێک ڕوودەدات کە شوێن گرتەکە ستوونی بێت. درزەکان لەو شوێنانەی سەر ڕووی زەوی دەبینرێن کە تاوێرەکانیان جووڵاون. بەشێوەیەکی سەرەکیش لەو کاتە ڕوودەدات کە ڕووی زەوی لەناکاو دەکرێتەوە.

### سەنتەری بوومەلەرزە

ئەو خاڵەی کە یەکەم جووڵەی لەرزینەکەی لێ ڕوودەدات پێیدەوترێت سەنتەری بوومەلەرزە یاخود (ئیپی سێنتەر) لەوێدا ئاستی لەرزینەکە یەکجار بەهێزە و بۆ هەموو لایەک شەپۆلی لێدەردەچێت. بە توێژینەوە لە بوومەلەرزە و شەپۆلەکانی بوومەلەرزە دەوترێت زانستی بوومەلەرزە (سیسمۆلۆژیا).

**هێزی لەناوبەر:** ناتوانرێت بەر لە هێزی تسۆنامی بگیرێت. شەپۆلەکانی تسۆنامی یەک بەدوای یەک دادێن، تا دەگەنە لێوارەکانیش گەورەتر دەبن. هەربۆیە ترسناک و وێرانکەرن. بەندەرەکان لەناو دەبەن و شار و شارۆچکەکانیش وێران دەکەن. ئەمە جگە لەوەی کەشتییەکانی ناو ئاویش ڕادەماڵن.

# داهێنراوەکان

**ڕادیۆ 1895:** ڕادیۆ ئامێرێکی پەخشکردنە. ئامێری ناردنی ڕادیۆیی بەشێوەی شەپۆڵەکانی کارۆموگناتیسی، زانیاری دەنێرێ و ئامێری وەرگرتنی ڕادیۆیش، شەپۆلە نێردراوەکان کۆدەکاتەوە و دەیان گۆڕێت بۆ دەنگ. گوگلیلمۆ مارکۆنی ئەندازیارێکی کارەبایی ئیتالی بوو. بە گەشەپێدەری سیستەمی تەلەگرافی بێ تەلی (کردارەکی ڕادیۆیی) ناسرابوو. لەساڵی 1895 ڕادیۆی داهێنا. بەهۆی بەشداریکردنی لەگەڵ کارڵ فێردیناند براونی ئەڵمانی لە بەرەوپێش بردنی تەلەگرافی بێ تەلی، بە هاوبەشی خەڵاتی نۆبلی بواری فیزیایان پێدرا. گوگلیلمۆ ڕۆژی 25ی نیسانی ساڵی 1874 لە وڵاتی ئیتالیا هاتەدونیا، ڕۆژی 20ی تەمموزی ساڵی 1937 لە ڕۆما کۆچی دوایی کرد.







**وێنەی تیشکی ئێکس 1895:** لە زانستی پزیشکی، شەپۆڵی شاراوە لە تیشکدانەوەی کارۆموگناتیسی بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی کەموکورتی لە بەشەکانی ناوەوەی لەشی مرۆڤ. ساڵی 1895ویلهێلم کۆنراد ڤۆن ڕۆنتگێن ئەم تیشکەی دۆزیەوە، بۆیە هەندێک جار بەتیشکی ڕۆنتگێن ناودەبرێت. هەروەها ناوبراو تەکنیکێکی بۆ یەکەم وێنەگرتنی تیشکی X داهێنا. لەساڵی 1895 یەکەم خەڵاتی نۆبلی بەشی فیزیای پێدرا. هەروەها بەهۆی کارکردنی لە بواری تیشکی X لەلایەن کۆمەڵگەی شاهەنشاهی مەدالیای ڕامفۆردی پێدرا. ویلهێلم کۆنراد ڤۆن ڕۆنتگێن ساڵی 1854 لە ئەڵمانیا هاتەدونیا ڕۆژی 10ی شوباتی ساڵی 1923 لە شاری میونیخ کۆچی دوای کرد.







# داهێنراوەکان

## سایگیمۆمەتر 1896:
سایگیمۆمەتر یان پێوەری پاڵەپەستۆی خوێن، ئامێرێکە بۆ پێوانەکردنی پاڵەپەستۆی خوێنی ناو لەشی مرۆڤ بەکاردێت. لەساڵی 1896 لەلایەن (سیپۆن ڕیڤە ڕوسی) پزیشکی ئیتالی داهێنرا. ناوبراو پزیشکی منداڵان و هەناوبوو. لە ڕۆژی 7ی ئابی ساڵی 1863 هاتەدونیا و ڕۆژی 15ی ئازاری ساڵی 1937 کۆچی دوای کرد.





## تۆڕبینی هەڵمی 1897:
تۆڕبینی هەڵمی ئامێرێکە بۆ گۆڕینی گەرما وزە بۆ میکانیکە وزە بەکاردێت. لەم ئامێرەدا هەڵم لە ژێر پاڵەپەستۆی شەفرەکانی ناو بۆیلەرەکان دەردەچێت، لەنێوان شەفرەکانیش کەلێن هەیە تاکو هەڵمەکەیان بەناویدا ڕەتبێت. ئەو هەڵمە بەهێزە وەها لە شەفرەکان دەکات بەخێرایی بسووڕێنەوە. سێر چارلیس ئەلیگرنۆن پارسۆنس ئەندازیارێکی ئێرلەندی بوو، وەک ئەندازیاری دیزاین کردنی داینەمۆ و تۆڕبین و مۆلیدە کاریدەکرد. بە داهێنەری تۆڕبینی هەڵمی ناوبانگی دەرکرد. کاریگەری زۆریشی لەسەر دەریاوانی و بەشی ئەندازەی کارەبایی هەیە. لەساڵی 1854 هاتەدونیا و لەساڵی 1931 کۆچی دوایی کرد.



سەرچاوە: کتێبی داهێنەرەکان

# 10 پانتاییە ئاوییە گەورەکانی جیهان

ئۆقیانووسەکان 70%ڕووی زەوی دادەپۆشن و خاکیش 97% ئاو لە ئۆقیانووسەکان وەردەگرێت. هیچ هەسارەیەکی دیکەی کۆمەڵەی خۆر، ئاوی لەسەر نییە. دە ڕووبەرە فراوانە ئاوییەکانی سەر ڕووی زەوی ئەمانەن:

**ئۆقیانووسی هێمن:** فراوانترین پانتایی ئاوییە، لەلایەک لە جەمسەری باکوور بەرەو ئەنتاریکتا و لەلایەکی دیکەش لەنێوان هەردوو ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتەوە و ئاسیا و ئوستراليا لە ڕۆژئاواوە هەڵکەوتووە. ڕووبەرەکەی 180 ملیۆن کلیۆمەتر چوارگۆشەیە کە هێلی نێودەوڵەتی (دەیت)ی بەناودا ڕەتدەبێت.





**ئۆقیانووسی ئەتڵەسی:** دووەمین ڕووبەری گەورەی ئاوییە. لە ڕۆژهەڵاتەوە، ئەورووپا و ئەفریقا و لە ڕۆژئاواشەوە هەر دوو ئەمەریکا بەیەک دەگەیەنێت. لەگەڵ ئۆقیانووسی جەمسەری باکوور لەباکوور بەیەک دەگەن. ڕووبەرەکەی دەگاتە 106.4 کیلۆمەتر چوارگۆشە. قوڵیەکەشی دەگاتە 12881 پێ. زۆربەی نەتەوە پیشەسازییەکان دەکەونە سەر لێوارەکانی ئەم ئۆقیانووسە، بۆیە گرنگترین پانتاییە بۆ بازرگانی.



**ئۆقیانووسی هیندی:** ئەم ئۆقیانووسە دەکەوێتە نێوان ئەفریقا و ئوستراليا. سێیەم پانتایی گەورەی ئاوییە لە جیهاندا. نزیکەی 20% ئاوی ڕووی زەوی گرتۆتە خۆ، هەروەها 10 هەزار کیلۆمەتر بەرینە و ڕووبەرەکەشی 73556000 کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، هەریەک لە دەریای سوور و کەنداوی فارسیش دەگرێتەوە.



**ئۆقیانووسی جەمسەری باکوور:** لە لوتکەی گۆی زەوی هەڵکەوتووە. دەکەوێتە باکووری کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەورووپا و ئەمەریکای باکوور. ڕووبەرەکەی 14056000 کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، ناوەندە قوڵیەکەشی 3953 پێیە. هەرچەندە بەتەواوی بە ئۆراسیا و ئەمەریکای باکوور دەورە دراوە، بەڵام بەدرێژایی ساڵ بە بەفر داپۆشراوە.

**دەریای کاریبی:** گەورەترین دەریای سوێرە. ڕووبەرەکەی نزیکەی 2754000 کیلۆمەتر چوارگۆشەیە. قووڵترین خاڵی (کەلیمانترۆ)ی ناوەکە دەکەوێتە نێوان کوبا و جامایکا و قووڵییەکەی 7676 مەترە.





**دەریای باشووری چین:** ئەم دەریایە لە ئیکوادۆرەوە بەرەو خولگەی قرژاڵ درێژ دەبێتەوە و ڕووبەرەکەی دەگاتە 2.8 ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە. بەهۆی هەڵکەوتەکەیەوە ئەو ناوەی لێنراوە.

**دەریای ناوەڕاست:** ئەم دەریایە بە درێژی 3900 کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، ڕووبەرەکەی 2.5 ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و پانیەکەشی دەگاتە 1600 کیلۆمەتر. پاشماوەی دەریایەکی کۆنە کە تیسایزی پێدەوترێ.

ی ئەم کێشەیە بریتییە
دووبارە بەکارهێنانەوەی.
ئەم مەبەستەش پلاستیکە
ڕهێنراوەکان لە شوێنێکی
ت کۆدەکرێنەوە کە سەنتەری



**دەریای بێرنینگ:** هەشتەم پانتایی ئاوییە لە جیهاندا و بەشێکیشە لە زەریای هێمن. ڕووبەرەکەی لە 2 ملیۆن کیلۆمەتر چوار گۆشە زیاترە و سنووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی ئالاسکایە. لە ڕۆژئاواشدا سیبیریا و نیمچە دوورگەی کامچادکاو لە باشووریشەوە نیمچە دوورگەی ئالاسکا و دوورگەی ئەلۆتەین و لە باکووریشەوە تەنگەبەری بیرنینگ لەیەک جیادەکاتەوە. ئەم تەنگەبەرەش دەریای بیرنینگ لە ئۆقیانووسی هێمن جیادەکاتەوە.

بکرێت کە لە کاتی فڕێدان بە ئاسانی دەشکێت.

**کەنداوی مەکسیک:** ئەم کەنداوە بەشێکە لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و پانییەکەی 1500 کیلۆمەترە، حەوزی کەنداوەکە 1.6 کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و لەگەڵ دەریای کاریبی بەشداری دەکات لە دروست بوونی دەریای ناوەڕاستی ئەمەریکا.

هەردوو جۆری پلاستیکی نەرم و کانیش بە چەندان ڕێگا بۆ بەرهەمی



**دەریای ئۆکهۆتسک:** ئەم دەریایە بەشێکە لە ئۆقیانووسی هێمن. دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای. ڕووبەرەکەی دەگاتە 1.5 ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە. قوڵترین ئاستی دەکەوێتە نزیک کوریلز کە 11033 پێیە. ئەم دەریایە لە مانگی تشرینی دووەم تا مانگی حوزەیران بە بەفر دادەپۆشرێ و تەمێکی ئەستووریش دەورەی دەدات.

# پلاستیک

پلاستیک ماددەیەکە دەتوانرێت بە چەندان شێوە لە قاڵب بدرێت و دابڕێژرێت. بەر لە 90 ساڵ بۆ یەکەمجار لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دروستکرا. پلاستیک ماددەیەکی سووکە بەڵام بەهێزە، دەتوانرێت ڕەنگاوڕەنگ و بریقەدار بکرێت. ماددەیەکی زۆر بەکەڵکە چونکە بەئاسانی ناشکێت و لە هەوای کراوەش بەرگەی ژەنگهەڵهێنان دەگرێت. هەمیشە پلاستیک بەکاردێت بۆ دروستکردنی ئەو شتانەی کە لە ماددەی سروستی وەک دار و ئاسن دروستکراون.

* پلاستیک وەک دانەوێڵە هەڵدەگیرێت، پاشان دەنکە وردەکانی دەتوێنرێنەوە و لە قاڵب دەدرێن.

(دەیت)ی بەناودا ڕەتدەبێت.



## لەبەرچی پلاستیک؟

* پلاستیکی نەرم بەکاردەهێنرێت بۆ دروستکردنی دیواری ناو حەمامەکان و کیسەی زبڵ.

* پلاستیکی ڕەق بەکاردێت بۆ دروستکردنی کورسی و کڵاو.

ئاوییە لە جیهاندا. نزیکەی 20% ئاوی
زەوی گرتۆتە خۆ، هەروەها 10 هەزار
بەرینە و ڕووبەرەکەشی 73556000
چوارگۆشەیە، هەریەک لە دەریای سوور و
فارسیش دەگرێتەوە.

* پلاستیک ئاسان پاک دەکرێتەوە و بەرگەی شکانیش دەگرێت. بەکاردەهێنرێت بۆ هەڵگرتنی خۆراک و دروستکردنی قاپ و قاچاغی وەها کە لە گەشتەکان بەکاریان دەهێنین.







* پلاستیک بەرگەی بەفر و باران دەگرێت، بۆیە بۆ دروستکردنی کابینەی تەلەفۆنی سەرشەقام بەکاردەهێنرێت.



## دووباره بەکارهێنانەوەی پلاستیک

لەبەر ئەوەی پلاستیک بە ئاسانی ناشکێت، دوای فڕێدانیش شوێنێکی فراوان داگیر دەکات، بۆیە تاکە چارەی ئەم کێشەیە بریتییە لە دووبارە بەکارهێنانەوەی. بۆ ئەم مەبەستەش پلاستیکە بەکارهێنراوەکان لە شوێنێکی تایبەت کۆدەکرێنەوە کە سەنتەری دووبارەبەکارهێنانەوەی پلاستیکە، پاشان دەبرێنە کارگەکان و لەوێدا دەتوێنرێنەوە و لە قاڵب دەدرێنەوە بۆ ئەوەی دووبارە کەل و پەلی وەک گوڵدان و سەبەتەی زبڵی لێدروست بکرێتەوە. هەوڵیش دراوە جۆرە پلاستیکێک دروست بکرێت کە لە کاتی فڕێدان بە ئاسانی دەشکێت.

* پێش دووبارە بەکارهێنانەوەی پلاستیک، پێویستە هەردوو جۆری پلاستیکی نەرم و پلاستیکی ڕەق لە یەکتری جیا بکرێنەوە. جۆرە جیاوازەکانیش بە چەندان ڕێگا بۆ بەرهەمی نوێ بەکاردەهێنرێنەوە.

## پلاستیک لە برین پێچیدا

هەندێک جۆری پلاستیک بۆ ناو لەش ئاساییە و هیچ مەترسی نییە. بۆیە بورغی و دەمبووسی پلاستیکی بەکاردەهێنرێت بۆ بەیەک گەیاندنەوەی ئێسکی شکاوی ناو لەش. هەروەها چەندان جۆری پلاستیکی جیاواز بەکاردەهێنرێن بۆ دروستکردنی داو تاکو لە دوورینەوەی برینەکانی لەشی مرۆڤ بەکاربهێنرێن.

# پیس بوونی ژینگە بە ئاوەڕۆ

هەر شوێنێک شارستانی لێبێت، پاشماوەی ئاوەڕۆی لێ بەدی دەکرێت.  کە ناتوانین دەستبەرداری بین. شارستانیەتەکانیش بۆ ڕزگاربوون لە پاشماوەکان بەردەوام هەوڵی بەرەو پێشبردنی سیستەمی ئاوەڕۆیان دەدا. زۆربەی ئاوەڕۆی شارستانە دێرینەکانی، وەک ئاشوورییەکان و بابلییەکان و یۆنانییەکان، بەهۆی لەناوچوونی شارستانیەکان بەدیارکەوتوون.

سیستەمی ئاوەڕۆی ڕۆمانی

ڕۆمانییەکان هەمان ئەو سیستەمەی ئەمڕۆیان پیادە دەکرد بۆ ڕاکێشانی ئاو. لەسەدەکانی ناوەڕاستیش ئاوەڕۆکان بەشێوەی جۆگە لە وڵاتە ئەوروپییەکان دروستکران. هەر کاتێکیش کە پاک دەکرانەوە پاشماوەکانیان دەخرانە ناو ڕووبارەکان یان وەک ماددەی کیمیایی بۆ زەوی کشتوکاڵی بەکاردەهێنران.

لەگەڵ ئەوەی لەسەدەی بیستەم بە هەزارەها میل بۆ هێڵی ئاوەڕۆ دروستکرا، تا مرۆڤ ڕزگاربکات لەو هەموو پاشماوانە، کەچی کێشەکە تا ئێستا بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە و بە ئاشکرا پاشماوەکان دەرژێنرێنە ناو دەریاکان. ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی و ڕاستەوخۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و تێکدانی ژینگەی بوونەوەرانە. پاشماوەی ژەهراوی دەبێتە هۆی لە ناوبردنی ژیانی ئاژەڵ و ڕووەک. ئەو ماددە خۆراکییەی لە پاشماوەکاندا هەیە، دەبێتە هۆی کوژرانی ژیانی ئاوی، چونکە هاندانێکی گەورەی زۆربوونی قەوزەیە. کە قەوزەکانیش دەمرن بەکتریاکان هەموو ئۆکسجینەکەی ناو ئاوەکە بەکاردەهێنن تا قەوزەکە شیبکەنەوە. ئەم کردارە پێیدەوترێت ئیترۆفیکەیشن. ئەمەو زۆربوونی بڕێکی زۆر لە ماددەی خۆراکی، دەبێتە هۆی مردنی ڕووەک و ئاژەڵە ئاوییەکان بە هۆی نەمانی ئۆکسجین.









چارەسەری ڕووەکی بەکاردەهێنرێ لە ڕێگای بەستنی چەندان فیلتەر و تەکنۆلۆژیای کیمیایی و بایۆلۆژی بۆ پاککردنەوەی ئاوەڕۆکان و پاشماوە ئاوییەکان. هەندێک لە ڕووەکە نوێیەکان زۆر چالاکن، ئاوەڕۆ دەگۆڕن بۆ پەینێکی پاکی کیمیایی، تا جوتیار و باغەوانەکان بتوانن بەکاریبهێنن.

بەڵام باشترین چارەسەری ئاوەڕۆ لە ڕێگای ڕووەکەوە ناتوانێ بەتەواوی چارەسەری کێشەی ئاوەڕۆ بکات. لە هەموو لایەکی گۆی زەوی ئەم دیاردەیە وەک کێشەیەکی گەورە وایە، تا دێت ئاستی پیس بوونی کەنارەکان بەرەو زیادی دەچێت، بۆیە پێویستە چارەسەری ڕووەکی بەفراوان پیادەبکرێت. بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵ و پارەی زۆری گەرەکە.









کارگەی خاوێنکردنەوەی ئاوەڕۆ




چارەسەری کێشەی ئاوەڕۆ و ئەو گۆڕانکارییەی لە ژینگەدا دروستی دەکات کارێکی ئاسانە. هیچ پێویست ناکات کە ژیانی ڕۆژانەی خەڵک بگۆڕێت یاخود ڕێکخراوی پاراستنی ژینگەی لێ ئاگادار بکرێتەوە. بەڵکو دەبێت بری پێویست لە بودجە تەرخان بکرێت بۆ بنیادنانی سیستەمێکی ئاوەڕۆی پێشکەوتوو کە هەموو لایەکی وڵات بگرێتەوە. ئەمەش شان بە شانی سیستەمێکی چارەسەرو خاوێنکردنەوەی ئاوەڕۆکان تا دووبارە سوود لەو ئاوەڕۆیانە وەربگیرێتەوە.

# ئەختەبووت

ئەختەبووت ئاژەڵێکی نەرمی بێ بڕبڕەیە. زانایان لەو بڕوایەدان لە هەموو بوونەوەرێکی دیکە ژیر تر بێت. خاسیەتی تایبەتی هەیە لە ڕەفتار و شێوازی ڕاوکردن و بەرگری کردن. هەشت باڵی هەیە، لەسەر هەر باڵێکی 240 مژەر هەیە و بەهۆی ئەم مژەرانە دەتوانێت تام و چێژی هەموو ئەو شتانە بزانێت کە دەیانگرێت.



کەواتە دەتوانین بڵێین هۆکارێکی هەستیاری بۆنکردنن. ئەختەبووت دەتوانێت بەخێراییەکی سەرسووڕهێنەر ڕەنگی خۆی بگۆڕێت تاکو خۆی لەگەڵ ڕەنگی دەوروبەرەکەی بگونجێنێت، هۆی ئەم کارەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، پێستەکەی بە ملیۆنەها خانەی ڕەنگاو ڕەنگ داپۆشراوە. لەکاتی هەست کردن بەمەترسیش ماددەیەکی ڕەش دەردەکات کە بە مەرەکەب دەچێت، بەمەش دوژمنەکەی ناتوانێت هیچ شتێک ببینێ و ڕاوی بنێت. هاوکات ئەختەبووت بۆ ڕاوانی نێچیر لەسەرخۆیە، چونکە هەردوو حاڵەتی مەلەکردن و ڕاونان تێکەڵ دەکات، بۆیە بەلایەوە باشترە خۆی لەنێوان بەردەکان مەلاس بدات و لە چاوەڕوانی نێچیر دابێت و لەپڕ هێرشی بکاتە سەر. مێینەی ئەختەبووت هەرجارەی 100 تا 150 هەزار هێلکە دادەنێت پارێزگاریشیان لێدەکات تاوادەی هەڵهاتنیان. هەروەها ئەختەبووت تاکە ئاژەڵە سێ دڵی هەبێت، دوویان خوێن بەرەو لووت و قورگ دەنێرن و دڵەکەی دیکەش خوێن بۆ بەشەکانی دیکەی جەستە دەنێرێت.

# کافوور

کافوور یەک لە دارە جوان و سەرنج ڕاکێشەکانە، قەدەکەی ڕاست و درێژە و بەرزییەکەشی دەگاتە 100 مەتر. لەبەر ئەوەی پێویستی بە بڕێکی زۆر لە شێ هەیە، بۆیە گەڵاکەی هەردەم سەوزە و لە ناوچە شێدارەکانی وڵاتانی ڤێتنام و باشووری چین و تایوان و باشووری ژاپۆن دەچێنرێت.



بەرەکەی لەشێوەی ترێیە و ڕەنگیشی لە نێوان وەنەوشەیی و ڕەشیدایە. دارەکەی لەبەر ڕەقی و تۆکمەیی، بۆ دروستکردنی بەلەم و بەندەر و ڕازاندنەوەی ماڵ بەکاردێت. ئەو ڕۆنەی کە لە گووڵ و گەڵا و ڕەگەکەی وەردەگیرێت، لە زۆر بوار سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت، چونکە لە ئاوێتەکانی کافوور و سافرۆل و ئیۆجینۆل و ترپینۆل و سینیۆل و لیگناتز دەوڵەمەندە و وەک پێکهاتەیەکی سەرەکی دەرمان دادەنرێت و ڕۆڵ دەگێڕێت بۆ چارەسەرکردنی چەندان نەخۆشی لەوانە نەخۆشیەکانی سک و گورچیلە و گوێ و هەوکردن و تەنگەنەفەسی. بۆ دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێنیش بە سوودە. هاوکات لە پیشەسازی بەرهەم هێنانی مەرهەمی چارەسەرکردنی ڕۆماتیزم و گرژبوونی دڵ و ئازارەکانی بڕبڕەی پشت و چەندان نەخۆشی دیکە بەکاردەهێنرێت. لەکاتی نەشتەرگەریشدا، وەک ماددەیەکی پاککەرەوە بەکاردەهێنرێت، هەر بۆیە لە پیشەسازی کرێم و بەرهەمەکانی دیکەی ئارایشتکردن پشتی پێدەبەسترێت بۆ پاکراگرتنی پێست. لەبەر ئەو هەموو گرنگییە، بۆیە پێویستە بە هەستیارییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.



به دەستوپەنجە ڕەنگینەکانت و بە پێی ژمارەکان ئەم وێنەیە ڕەنگ بکە.

1-کەسک 2-قاوەیی 3-زەرد 4-سوور 5-شین.


golf club
hand mirro
envelope
light bulb
teacup
sock
pencil
button
هەریەک لەم وێنانە لە وێنەکەی سەرەوەدا بدۆزەرەوە.
paintbrush
butterfly
ring
necklace
slice of pie
ruler
boomerang
yo-yo
tack
feather



شەش جیاوازی لە نێوان ئەم دوو وێنەیەدا بدۆزەرەوە.



ڕێگەی ڕاست لە فڕۆکەکەوە تا بورجەکە دیاری بکە.




بۆ تەواکردنی ئەم وێنەیە خاڵەکان بەیەکتر بگەیەنە.